# وەسیەتی واجب

١- پێناسەی وەسیەتی واجب:- وەسیەتێکە واجب بووە لە سێیەکی میراتی مردووەکە بۆ ئەو منالەی کە پیش خۆی مردوە واتە کورە یان کچە پیش باوکی یان دایکی دەمرێ یان لەگەڵ یەك مردون وەکو روداو و خنکان و ..... .

٢- بەڵگەی وسیەتی واجب:- خوای تعالى لە سورەتی البقرە ئایەتی ١٨٠ دەفەرموێ{ كتب عليكم اذا حضر احدكم الموت ان ترك خيرا الوصية للوالدين والاقربين بالمعروف حقا على المتقين }

٣- بۆچونی مەزهەبەکان لە وەسیەتی واجب:- بە بۆچونی هەندی لە زانایان وەسیەت واجب نیەو ئایەتی باس کراو { كتب عليكم } مەنسوخە و حوکمەکەی هەڵوەشاوەتەوە بە ئایەتی میرات وەکارکردن بەو وەسیەتە لەسەرەتای ئیسلام بووە پاشان بە ئایەتی میرات حوکمەکەی نەما هەروەها بەفەرمودەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم { ان الله اعطى كل ذي حق حقه فلا وصية لوارث} بەلام بەلای هەندێکی تر لە زانایان واجبە وەسیەت و وەلامی ئەوەی کە دەڵین ئایەتەکە منسوخە تەنها ئەوە منسوخە و نەماوە بۆ داك وباب و ئەو خزمانەی کە میراتگرن بەلام ئەوەی میراتگر نیە دەرحەقی ئەو حوکمەکەی هەر ماوە کە وەسیەتی بۆ واجبە. ئەوەی کە راستە ئەوەیە کە ئایەتەکە موحکەمە وە ئەوانەی کە دەڵین وەسیەت واجبە مەزهەبی زۆر لە زاناکانی تابعینە و جگە لەوان لە پیشەوایانی فەرموودە وفقە لەوانە سعید کوری مسیب و حەسەنی بەصری و طاوس و امام ئەحمەد و داودی زاهری و ابن حزم وپیشەوا شافعی لە قەولی قەدیم.

٤- ئەوانەی کە شایەنی وەسیەتی واجبن : ئەو فەرعەی نامیرات گرن لە مردوەکە ئەمانەن:-

ا- چینی یەکەم لە منالی کچانی پشتی مردوەکە واتە کوری کچی مردوەکە و کچی کچی مردوەکە تەنها لە چینی یەکەم و زیاتر نا.

ب- منالانی کوری مردوەکە بە نێر و مێ هەتا بۆ خوار تربێ.

٥- مەرجەکانی شایەن بوون بە وەسیەتی واجب:-

ا- دەبی وەسیەت بۆ کراوەکە فەرعی مردوەکە بیت : کوری کور یان کوری کچ ، بەلام ئەوانە نا { باب – برا – مام – میردی ژنە مردوەکە و ژنی مردوەکە} بۆ ئەوانە وەسیەتی واجب نیە .

ب- نابی وەسیەت بۆ کراو میرات گر بێ نە بە فەرز و نە بە تعصیب.

ج– نابیَ مردووەکە هیچی بەخشی بیتە ئەوانەی وەسیەتیان بۆ کراوە بە بی بەرامبەر وەکو دیاری واتە وەکو ئەوە دیاری پی دابن بە ئەندازەی وەسیەت ئەوە بۆیان نابی بەلام گەر کەمتری پی دابن لە وەسیەت بۆیان تەواو دەکری تاوەکو دەگاتە ئەندازەی وەسیەتەکە کە واجبە .

٦– ئەندازەی وەسیەتی واجب :– ئەوبەشەیە کە ئەگەر فەرعە مردوەکە ی مردوە پیش باوکی یان دایکی مابا چەندی بەردەکەوت بەلام لە سێیەکی میرات زیاتر نەبیَ.

٧– هەر ئەصلیك دەتوانی تەنها فەرعی خۆی بیبەش بکات ناتوانی فەرعی غەیری خۆی بیبەش بکات .وە منالەکانی مردوەکە کە بەشی خۆیان وەرگرتوە بە وەسیەتی واجب ئەگەر نیرو می بن ئەوا { للذکر مثل حظ الانثیین} دەبی .

٨– ئەگەر ئەوانەی لە ژیانی باوکیان یان دایکیان مردون واتە پیش دایك وباوك لە یەك زیاتر بن نابی وەسیەتەکە لە سێیەکی میرات زیاتر بکریَ .

٩– حالاتەکانی وەسیەتی واجب:–

ا– ئەو فەرعەی کە پیش باوکی یان دایکی مردوە گەر زیندوبا کەسی بیبەش نەدەکرد لە میراتگرە زیندوەکانی تر کاتی مردنی باوکی یان دایکی بەمانایەکی تر ئەگەر ئەو مردوەی پیش باوك و دایکی مردوە ئەگەر نەمردبا و دوای باوك ودایکی مردبا و نەدەبوە هۆی بیبەش کردنی ئەوانی تر لە میرات کە ئەم حالەتە ناسراوە بە { عدم تعذر تصحیح المسألة } واتە راست کردنەوەی مەسئەلە دەکریت زەحمەت نیە .

ب– ئەگەر ئەو مردوەی پیش باوك و دایکی گەر نەمردبا ئەوانی تری بەتەواوی بیبەش دەکرد یان بیبەش کردنیکی کەمی دەکرد یان هەندێکیانی بیبەش دەکرد کە ناسراوە بە { تعذر تصحیح المسالة } ئەوا کارەکە جیاوازە لەخوارەوە رۆن کراوەتەوە:–

ا– لەحالەتی یەکەم واتە { عدم تعذر تصحیح المسألة } : بەشی کورەکە یان کچەکەی پیش باوکی یان دایکی مردوە بەگویرەی بەشی خۆی گەرمابا بۆی زیاد دەکریتە سەر مەسئەلە بەمەرجێك لە سێیەك زیاتر نەبی.

ب– لە حالەتی دووەم واتە { تعذر تصحیح المسالة } وا تەقدیر دەکریَ کە مردوەکەی پیش باوك و دایکی لە ژیان ماوە وبەشی خۆی دەدریتی بەلام لە سنوری سێیەك بیت و زیاتر نەبی لە سێیەك.

ڕێگای دەرهێنانی وەسیەتی واجب :

حالەتی یەکەم:– { عدم تعذر تصحیح المسألة } :– بەم هەنگاوانە ئەنجام دەدریَ :

- دیاری کردنی فەریزەکە تا بەشی هەریەك لە میراتگران دیار بێت.

- **بەشی نمونەی کورە یان کچە مردوەکەی پیش دایك یان باوك زیاد دەکری بۆ ئەصلی مەسئەلە واتە دەخریتە سەر ئەصلی مەسئەلە .**
- **ئەصلی مەسئەلە کۆ دەکەینەوە لەگەل بەشە زیاد کراوەکە و ئەنجامەکە دەبیتە ئەصلی مەسئەلە.**
- **میراتەکە دابەشی ئەو ئەنجامە کۆکراوە دەبیت تا ئەندازەی یەك سهم دەرچێ .**
- **خاوەنی وەسیەتی واجب بەشەکەی دیاری دەکری چەندە دەدری بەمنالەکانی ئەو.**
- **ماوە دابەشی سەر زیندوەکان دەکری**
- **وەسیەتی واجب لە هیچ حالەتیك نابی لە سێیەك زیاتر بێت.**

**نمونە :- پیاوێك مردوە لە پاشی بە جیماوە{ باب – داك – ژن – کور – کچی کچ } ئەو کچە پیش باوکی مردوە کچیکی هەیە بە وەسیەتی واجب پیی دەدرێ:**

**باب :- ١/٦ ، داك ١/٦ ، ژنەکە ١/٨ ، ماوە بۆ کورەکە ، بۆ کچی کچ وەسیەتی واجب.**

**ئەصلە مەسئەلەکە لە ٢٤ : بۆ باوکەکە شەش یەك واتە ٤سهم و بۆدایکەکەش بەهەمان شیوە ٤ سهم و بۆژنەکە هەشت یەك ٣ سهم و بۆ کورەکە ماوە ١٣ سهم و بۆکچی کچەکە وەسیەتی واجبە کە نیوەی کورەکەیە واتە ١٣÷٢= ٦.٥ شەش سەهم و نیو تا مەسەلە راست بکریتەوە : ٢× ٢٤ = ٤٨ واتە بۆ باوکەکە ٤×٢=٨ بۆ دایکەکەش هەمان ٨ سهم و بۆ کورەکە ٢٦ سهم و وەسیەتە واجبەکە ٦.٥×٢=١٣ سهم ئینجا وەسیەتە واجبەکە کە ١٣ سهمە لەگەل مەسئەلە کۆدەکەینەوە واتە ٤٨+١٣=٦١ ئینجا وەسیەتی واجبی لێ دەردەکەین دەیدەین بە کچی کچ ٦٣-٤٨=١٣ سهم و ماوە ٤٨ دابەش سەر زیندوەکان دەکرێ:**

**باوکەکە ٨ سهم ، دایکەکە ٨ سهم و ژنەکە ٦سهم و کورەکە ٢٦ سهم .**

**حالەتی دووەم:- { تعذر تصحيح المسالة }: لەم حالەتەدا وەکو حالەتی یەکەم نیە وەسیەتە واجبەکە بۆ کورە یان کچە مردوەکە زیاد بکری بۆسەر ئەصلی مەسئەلە بەلکو هەر لەسەرەتاوە وا دائەنری کە نەمردوە وبەشەکەیان دەدریتی بە وەسیەتی واجب بەلام وەك گوتمان لە سێیەك زیاتر نەبی بۆزیاتر رۆن کردنەوە :**

**نمونە : پیاویك مردوە لەپاشی بەجیماوە {ژن – ٢کچ- خوشك لەداك وباب – کچی کور} دیارە کە کورەکە پیشی باوکی مردوە وە لەو مەسئەلەدا دەگوتری ئەگەر کورەکە پاشی باوکی مردبا واتە کاتی باوکی مردوە ئەو لە ژیاندابا ئەوا خوشکەکەی لەداك وباب بیبەش دەبوو بەتەواوی و دوای بەشی ژنەکە ماوە بۆ کورو دوو کچەکە دەبو{للذکر مثل حظ الانثيين } جا وای دادەنیین کە ماوە وەسیەتە واجبەکە دەدری بە منالەکانی بەمەرجی لە سییەك زیاتر نەبی :**

| ژن | ٢کچ | خوشك لە داك وباب | کچی کور | |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ٢/٣ | ماوە | وەسیەتی واجب | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | |

**ئیستا نمونەکە حەل دەکەین بەشیوەیەك کە کورەکە هەر لەسەرەتاوە ماوە نەمردوە :-**

**ژنەکە هەشت یەکی هەیە و ماوە ۷ بەش بۆ کورەکە و ۲ کچەکە للذکر مثل حظ الانثیین وە یان ماوە ۲۱ بەش لە ۲٤ بەش بۆ کورەکە و دوو کچەکە دەبی بەلام بەشی کورەکە زیاترە لە سییەکی میرات بۆیە تەنها سییەك دەدری بە خاوەن وەسیەتی واجب کە ۸ لە ۲٤ ، وە ماوە بۆ ئەوانی تر بۆ ژنەکە هەشت یەك و بۆ دوو کچەکە دوو سێیەك و بۆ خوشکەکە ماوە واتە ئەگەر وا دانیین کە میراتەکە ۳٦۰ دۆنم زەوی هەیە ئەوا سێیەکەکەی بریتی یە لە ۱۲۰ دۆنم دەدری بە خاوەن وەسیەتی واجب واتە کچی کور و ماوە ۲٤۰ دۆنم بۆ ئەوانی تر بەدابەش کردنی میرات بۆ ژنەکە هەشت یەك واتە ۳۰ دۆنم و بۆ دوو کچەکە دوو سێیەك ۱٦۰ دۆنم هەر کچی ۸۰ دۆنم و ماوە ٥۰ دۆنم بۆ خوشکەکەی لە داك وباب .**

**وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين**